# كۆكردنەوەی نوێژ

## لە ڕوانگەی قورئان و سوننەت دا

نوسینی

أحمد ملا فائق سعيد

چاپی یەکەم

١٤٣٦هیجری

عن ابن عباس رضي الله عنهما قال:

«جَمَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ.
وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ».

رواه مسلم (١٦٣١).




# کۆکردنەوەی نوێژ

## لەڕوانگەی قورئان و سوننەت دا

نوسینی

أحمد ملا فائق سعيد




چاپی یەکەم

١٤٣٥ هیجری



ناوی کتێب: کۆکردنەوەی نوێژ لە ڕوانگەی قورئان و سوننەت دا.

ناوی نوسەر: أحمد ملا فائق سعید

لاپەڕە: ٥٢ لاپەڕە / ١٢ x ١٧ سم

شوێنی چاپ: چاپەمەنی سیما / سلێمانی

نۆرەی چاپ: دووەم

ساڵی: ١٤٣٦ هـ - ٢١٠٥ م

ژمارەی سپاردن: (١٣٧٠) ساڵی ٢٠١٥ م

ahmadmalafaiqsa3id@gmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل الله فلا هادي له. وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، وبعد.

بێگومانین لە کاملّی ئایینی ئیسلام بە گرتنەوەی هەموو بوارو کەلێن و لایەنەکانی ژیان بۆیە شایستەی مانەوەو زیندوویەتی یاساکانیەتی لەناو ئادەمیزاددا بەتێپەڕبوونی چەندەها سەدەو مانەوەی وەکو خۆی.

فراوانی و کار ئاسانی و خوێندنەوەی هەموو پێویستی و لایەنەکان خالّی سەرەکی یاساکانی ئیسلامە، بەتایبەت بۆ کارێکی بەردەوام و خاوەن چەندێتی و چۆنێتی یەکی زۆری وەکو نوێژ.

بۆیە گەر ئاو نەبوو تەیەموم بکرێت، وە گەر نەیتوانی بە پێوە، بە دانیشتنانەوە نوێژ دەکات، وە گەر لە سەفەردا بوو کورت دەکرێتەوە.

هەروەك ڕێگە نادات لەپێش کاتە دیاری کراوەکان دا نوێژەکان بکرێن، ڕێگەش نادات لە کاتەکانی خۆی دەرچێت، هەروەك ڕێگەی داوە کاتە پێویستیەکان و گشتییەکانی ئادەمیزاد نوێژەکانی تیادا کۆ

بکاتەوە وەکو (نیوەڕۆ بۆ عەسر) و (مغریب بۆ عیشا)، ڕێگە نادات (عەسر و مغریب) وە (عیشاو بەیانی) وە (بەیانی و نیوەڕۆ) کۆ بکرێتەوە لەبەر ئەوە لەم کاتانەدا پێویستی بە کۆکردنەوە نییە وە ئەوەی کاتەکانی دیاری کردووە بە فەرمان و کردار هەر ئەویش کاتی کۆکردنەوەی نوێژەکانی بەهەمان شێوە دیاری کردووە.

گەر بارقورسی و ئەرکی سەفەر هۆکاری نوێژ کورت کردنەوە بێت ئەوا هەمان بارقورسی بگرە زیاتر هۆکارە بۆ کۆکردنەوەی کاتەکانی بەبێ کورت کردنەوە، وە گەر ڕێگە بدرێت لەبەر هۆکاری نەخۆشی و سەفەر ڕۆژووی ڕەمەزان بە جیا جیا بگیرێتەوە لەکاتێك دا خوی بەسەر یەکەوە نەیگرتووە ئەوا کۆکردنەوەی نوێژە جیاکانیش ڕێگەی پێ دەدرێت.

وە گەر ئامادەبوونی خواردن و پێویستی سەرئاو هۆکاری ڕاگرتنی نوێژ بێت، «لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ، وَلَا هُوَ يُدَافِعُهُ الْأَخْبَثَانِ»[(١)] لەبەر بەدڵ ئاگالێبوونی و ماف دان بە نوێژەکە وەکو خوی گەر دروست بوونی سەرقاڵی و ئەرکەکان هەمان کاریگەرییان ببێت لەسەر نوێژەکان لەکاتی خوی دا ئەوا لەپێشترە نوێژەکانی بۆ کۆبکرێنەوە.

---

(١) البخاري (٦٧٢)، مسلم (٨٦١)، أبوداود (٨٢).

بەڵام دەبێت ئەم ڕێگەپێدراوانە (رخصة) لەشوێنی خوی دا کاری پێبکرێت بۆ کاتی زۆر پێویستی و بە مەرجی بەردەوام نەبوون لەسەری و بەبێ کەم تەرخەمی لەئەنجام دانی فرمانەکان وەکو خوی.

دەبینین ئەم کارە لەنێوان زیادە ڕەوی و کەم ڕەوی دا مافی دەخورێت، هەندێك ڕێگر دەبن لە کۆکردنەوەی نوێژ، بە دانانی کۆمەڵێك مەرج و هۆکاری مەزهەبی کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نییە، وە لە بەرامبەریش دا پێ ڕاکێشان و بە سادە سەیرکردن و گرنگی نەدان بە ئەصڵ و بناغەی کارەکە لە کەمترین باران دا، یان لە هەموو کاتەکانی سەفەردا، وە لە پێویستی بەردەوامە تایبەتییەکانی خوی دا، زۆر بە بێباکی نوێژەکان کۆدەکاتەوە و بگرە بە سوننەتیشی دادەنێت.

ئەمانە پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی زانستیانەی ورد هەیە بۆ زیاتر بەقەدرو بەها ڕاگرتنی کارە عیبادەتییەکان، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ﴾ [الحج : ٣٢].

بە قەدرو ڕێزو بەها سەیرکردنی کارو سیما ئاینییەکان نیشانەی خاوەن دڵێکی پڕ خواناسی و لەخوا ترسانە.

ئەم نوسینە هەوڵێکە بۆ ڕۆشنایی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، بە ئاواتی ڕەزامەندی پەروەردگار و پڕکردنەوەی کەلێنێك و پێکاندنی ڕاست و دروستی تیای دا.

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه

✍

أحمد ملا فائق سعيد

٢٧ / ذوالحجة / ١٤٣٥ هـ

٢١ / ١٠ / ٢٠١٤ م



# کاتەکانی نوێژ

١- کاتەکانی نوێژ لە قورئان دا: بە دوو شێوە هاتووە، بە شێوەی جیاجیا و بە شێوەی بەسەر یەکەوە.

پێنج کاتی و سێ کاتی ئاماژەی پێ کراوە (لە نزیکەی دە ئایەت دا)، پێنجی بۆ کەسانی خاوەن کات و ئیسراحەت، وە سێییش بۆ خاوەن پێویستی و عوزرەکان، وە سوننەتیش شیکەرەوەی تەواو ڕوونی و هۆکارەکانی داوە، بەم شێوە بەڵگەی قورئان و سوننەت یەك دەگرێت لەسەر کاتەکان[(١)].

أ- قال الله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾. [النساء : ١٠٣].

نوێژەکان لەسەر ئیمان داران فەرز کراوە لەکاتەکانی خۆی دا ئەو کاتانەی لای موسوڵمانان دیارییە[(٢)].

(١) إعلام الموقعين لإبن القيم (٢/ ١٠).

(٢) تيسير الكريم الرحمن لإبن السعدي ص٢٠٤.

ب- قال الله تعالى: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ۝١٧ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾. [الروم: ١٧، ١٨].

(ابن عباس) وتی: ئەمە کاتی پێنج نوێژەکەیە لە قورئان دا، (فسبحان الله حين تمسون) نوێژی مغريب و عيشا، (وحين تصبحون) نوێژی بەیانی، (وعشيا) عەسر، (وحين تظهرون) نیوەڕۆ[(١)].

ج- قال الله تعالى: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾ . [الإسراء: ٧٨].

ئەم ئایەتە پێنج کاتەکانی نوێژی تێدایە لە بەشی (لدلوك الشمس إلى غسق الليل) نوێژی نیوەڕۆو عەسر و مەغریب و عیشای لێ وەردەگیرێت و (قرءان الفجر) واتە نوێژی بەیانی، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ لێوەی وەرگیراوە بە کردارو گوفتار[(٢)].

ئەم ئـایەتە هێمـایە بۆ کـۆکـردنەوەی نوێژ لەکاتەکانی پێویست دا

(١) تفسير القرطبي (١٤/١٦).

(٢) تفسير ابن الكثير (٥/١٠٦).

بەگوێرەی ڕووکەشی دارشتنی ئایەتەکە.

٢- لە سوننەتەکانی پێغەمبەریش دا ﷺ زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

هەروەك ڕیوایەتەکەی (جابری کوڕی عبدالله) بەناوبانگە بە فەرموودەکەی (جبريل عليه السلام) پێشنوێژی بۆ پێغەمبەر کرد ﷺ دوو ڕۆژ، ڕۆژی یەکەم سەرەتای کاتەکانی نوێژ، دووەم ڕۆژیش کۆتا کاتەکانی نوێژو فەرمووی «ما بين هذين الوقتين وقت»[1]، وە کاتەکانیش بەشێوەی کردارو گوفتار فێری هاوەڵانی کردووە وەکو لە صحيحی مسلم دا (٦١٢)، وە أبوداود (٣٩٢)، وە النسائي (٢٦٠)، هەموو سەرچاوە فەرموودەکان دا سەردێرێك بەناوی کاتەکانی نوێژ نوسراوەتەوەو چی ڕیوایەت لەسەری هەبێت تیایدا تۆمار کراوە.

وە تەنانەت هەردوو جۆری کاتەکان پێنجی و سێیی بە وردی ڕوون کراوەتەوە.

(١) الترمذي (١٥٠)، النسائي (٢٦٣)، أحمد (٩٠).

# پاراستنی کاتەکانی نوێژ

١- قال الله تعالى: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ . [البقرة : ٢٣٨].

خوای پەروەردگار فەرمان دەدات بە پاراستنی نوێژەکان بە گشت کاتەکانی و مەرجەکانی، جێبەجێ کردنی و ملکەچی تیایدا، بەتایبەت نوێژی ناوەڕاست کە عەسرەوە بە ملکەچی و بەردەوامی بۆ پەروەردگار بوەستن[1].

٢- قال الله تعالى: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾. [مريم : ٥٩].

لەپاش پێغەمبەران گەڕانەوە دواوە، کاریان بەکەم سەیرکردن و فەوتانی نوێژەکان بوو کە فەرمانی پاراستنیان پێدرابوو بەهۆکاری شوێنکەوتەی حەزو ئارەزووەکانیان پێشخستنیان بەسەر مافەکەی پەروەردگاردا، بەو هۆکارانە سزای سەختی چەند بارەیان لە شیوێکی دۆزەخ دا وەك (غي) دەدرێت بە سەریان دا[2].

---

(١) تيسير الكريم الرحمن لإبن السعدي ص١٠٧.

(٢) تيسير الكريم الرحمن لإبن السعدي ص٥٧٢.

٣- قال الله تعالى: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾. [الماعون: ٤،٥].

سزای وەیل بۆ نوێژخوێنان، لەبەر لەدەست دان و نەکردن و نەهێنانەدی نوێژەکانیان بەشێوەی خۆی لە مەرج و روکن و کاتەکانیان دا وە گرنگی نەدان بە فەرمانەکانی خودا[1].

٤- قال الله تعالى: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ... وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾. [المؤمنون: ١ - ٩]، وقال الله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ دَآئِمُونَ﴾. [المعارج: ٢٣].

سەرکەوتن و کامەرانی و ڕزگاربوون بۆ ئەو ئیماندارانەی خاوەنی سیفاتی تەواون، ئەوانەی ملکەچن و ئامادەبوون بە دڵ لە نوێژەکانیان دا بەرامبەر یەزدان... وە ئەوانەی بەردەوامن لەسەر پاراستنی نوێژەکانیان بە کات و سنورو مەرجەکانیان[2].

(١) تيسير الكريم الرحمن لإبن السعدي ص١١٠٤.

(٢) تيسير الكريم الرحمن لإبن السعدي ص٦٣٩.

ئەوانەی بەردەوامن بە شێوەی تەواو و نەپچڕاو لەسەر نوێژەكانیان[١].

٥- قال رسول الله ﷺ «خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ عَلَى الْعِبَادِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّعْ مِنْهُنَّ شَيْئًا اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ، كَانَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، ...»[٢].

خوای پەروەردگار پێنج نوێژی فەرز كردووە لەسەر بەندەكانی، هەركەسێك ئەنجامیان بدات و بەشێوەی كەم و سوك سەیریان نەكات، هیچیان نەفەوتێنێت، لای خوای پەروەردگار پەیمانی تایبەتی پێدراوە بیخاتە بەهەشتەوە.

٦- قال رسول الله ﷺ «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الصَّلاةُ الْمَكْتُوبَةُ ...»[٣].

یەكەم كارێك بەندەی موسوڵمان لەسەری لێپرسینەوە دەكرێت نوێژە فەرزەكانە. (لە مافەكانی خودا دا).

---

(١) تيسير الكريم الرحمن لإبن السعدي ص١٠٥١.

(٢) مسلم (٨٨)، ابن ماجة (١١٥٠)، الترمذي (١٢٥).

(٣) صحيح ابن ماجة (٧٢)، والترمذي (٤١١)، والنسائي (٢٣٢).

## بەڵگەکانی کۆکردنەوەی نوێژ
## لە شوێنی نیشتەجێبوون دا (الحضر)

١- عن عبدالله بن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: «صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ الظُّهْرَ والعَصْرَ جَميعاً والمَغْرِبَ والعِشَاءَ جَميعاً في غَيْرِ خَوْفٍ وَلا سَفرٍ».

قال أبو الزبير: فسألت سعيداً: لم فعل ذلك؟ فقال: سألت ابن عباس كما سألتني، فقال: أراد أن لا يحرج أحداً من أمته[(١)].

عبدالله ی کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆکردەوە، مەغریب و عیشاشی کۆکردەوە بەبێ بوونی ترس و سەفەر.

ئەبو زوبێر دەڵێت: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد بۆ ئەم کارەی کرد؟ ووتی ئەم پرسیارەم لە عبداللە ی کوڕی عەباس کرد وەکو تۆ، ووتی:

ویستی هیچ کەسێك لە موسوڵمانان توشی نارەحەتی نەبێت.

---

(١) رواه مسلم (١٦٢٦)، والطبراني (١٢/ ٧٤)، والبيهقي (٣/ ١٦٦)، والبغوي في السنة (١٠٤٤).

٢- وعنه أيضاً قال: «جَمَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ، وَبَيْنَ المْغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ»[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشای لە مەدینە بەبێ ترس و باران کۆکردەوە.

جیاوازی ئەم دوو ڕیوایەتە دوو وشەیە:

١. (سفر). ٢. (مطر).

لە ڕیوایەتی دووەم دا لەبەر ئەوەی باسی شاری مەدینە (المدينة) ی کردووە ووشەی سەفەری لێ دەرکردووە و ووشەی باران (مطر) ی باس کردووە.

بۆ دڵنیابوون لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ هۆکارەکانی نوێژ کۆکردنەوە نوێژەکانی کۆکردوەتەوە، تا موسوڵمانان بۆ کاتی پێویست بەبێ ئەو هۆکارانە بتوانن بیکەن.

---

(١) رواه مسلم (١٦٣١)، وأبوداود (١٢١٠)، والنسائي في الكبرى (١٥٧٣)، وابن خزيمة (٩٧٢)، وابن أبي شيبة (٢/١١٣/١)، وأحمد (١/٣٤٦)، والطبراني في الكبير (٣/٩٩/١)، بڕوانە الإرواء (٥٧٩).

بەهەمان شێوەی پێشوو پرسیار لە (ابن عباس) دەکرێت بۆ ئەم کارەی کرد؟ ووتی (كي لا يحرج أمته)، تاوەکو گەلەکەی نارەحەت نەبن.

ابن تيمية رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمویێت: (فقوله "بالمدينة" يدل على أنه لم يكن في السفر، فقوله "جمع بالمدينة من غير خوف ولا مطر" أولى بأن يقال "من غير خوف ولا سفر"[(١)].

کاتێك دەڵێت لە (مەدینە) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەسەفەردا نەبوو لەبەر ئەوە وتنی (کۆی کردۆتەوە بێ ئەوەی ترس و باران بوبێت) لەپێشترە تاوەکو ووتنی (بەبێ ترس و سەفەر).

وە لەڕووی ڕیوایەتەوە دەقی "من غير خوف ولا مطر" بەهێزترو تەواو ترە لەبەر ئەوەی (حبيب بن أبي ثابت) یەکێکە لە پیاوانی ڕاویانی هەردوو (صحيحين: البخاري ومسلم)[(٢)].

بەڵام ئەوی تر (أبي الزبير)ە کە ڕاوییە تاکەکانی (مسلم)ە، بێگومان مەرجەکانی بخاری لە ڕاوییەکان دا زۆر بەهێزترە تاوەکو (مسلم).

٣- چەند ڕیوایەتی تر لە عبدالله ی کوڕی عەباسەوە بۆ زیاتر دڵنیابوون، وەکو:

---

(١) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٤٦).

(٢) فقه الجمع لمشهور حسن ص١٨٢.

أ. عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ سَبْعًا وَثَمَانِيًا: الظُّهْرَ وَالعَصْرَ وَالمَغْرِبَ وَالعِشَاءَ»(١).

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە نوێژی بە حەوت و بە هەشت کرد نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشا.

ب. عَنْ صَالِحٍ، مَوْلَى التَّوْأَمَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: «جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي الْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ»، قَالَ: فَقِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ التَّوْسِعَةَ عَلَى أُمَّتِهِ(٢).

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشای کۆکردەوە لە (مەدینە) بەبێ ترس و باران، لە (ابن عباس) یان پرسی بۆ ئەم کارەی کرد؟ ووتی: دەیویست بەرفراوانییەك بداتە گەلەکەی.

---

(١) رواه البخاري (٥٤٣،٥٦٢).

(٢) ابن أبي شيبة (٢/٤٥٦)، أحمد (١/٣٤٦)، عبدالرزاق (٤٤٣٤)، أبو يعلى (٢٦٧٨)، الطبراني (١٠٨٠٣)، حسنه الألباني في الإرواء (٣/٣٦)، وصححه شيخ أحمد شاكر في المسند (٣٢٣٥).

ج. عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي السَّفَرِ، وَالْحَضَرِ»[١].

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشای لە سەفەرو ماڵەوەدا کۆکردەوە.

٤- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ (بالبصرة) يَوْمًا بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَبَدَتِ النُّجُومُ، وَجَعَلَ النَّاسُ يَقُولُونَ: الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ، قَالَ: فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، لَا يَفْتُرُ، وَلَا يَنْثَنِي: الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتُعَلِّمُنِي بِالسُّنَّةِ؟ لَا أُمَّ لَكَ ثُمَّ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ». قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَقِيقٍ: فَحَاكَ فِي صَدْرِي مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، فَأَتَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، فَسَأَلْتُهُ فَصَدَّقَ مَقَالَتَهُ[٢].

---

(١) أحمد في المسند (٣/ ٤٣٢)، وصححه أحمد شاكر برقم (٣٣٢٣،٣٣٩٧).

(٢) رواه مسلم (١٦٣٤)، وأحمد في المسند (٢٢٦٩)، وصححه أحمد شاكر، أبو عوانة (٢/ ٣٥٤).

عبدالله ی کوڕی شەقیق دەڵێت: عبدالله ی کوڕی عباس لە بەسرە ڕۆژێك دوای عەسر ووتاری بۆ داین، بەردەوام بوو تاوەکو ڕۆژ ئاوا بوو، ئەستێرە دەرکەوت، خەڵکی دەیان ووت: نوێژ نوێژ، پیاوێك لە هۆزی بەنی تەمیم بەدوای یەك دا دەیوت: نوێژ نوێژ، عبدالله ی کوڕی عباس ووتی: ئەوە تۆ فێری سوننەتم ئەکەیت؟ پاشان ووتی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشای کۆکردەوە. عبدالله ی کوڕی شەقیق گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: لە دڵم دا شتێك لەسەر ئەمە دروست بوو، چوومە لای ئەبو هورەیرە پرسیارم لێکرد، قسەو ڕیوایەتەکەی بەڕاست داناو پەسەندی کرد.

ابن تيمية رحمه الله دەڵێت: فَهَذَا ابْنُ عَبَّاسٍ لَمْ يَكُنْ فِي سَفَرٍ وَلَا فِي مَطَرٍ وَقَدْ اسْتَدَلَّ بِمَا رَوَاهُ عَلَى مَا فَعَلَهُ فَعُلِمَ أَنَّ الْجَمْعَ الَّذِي رَوَاهُ لَمْ يَكُنْ فِي مَطَرٍ وَلَكِنْ كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ فِي أَمْرٍ مُهِمٍّ مِنْ أُمُورِ الْمُسْلِمِينَ يَخْطُبُهُمْ فِيمَا يَحْتَاجُونَ إلَى مَعْرِفَتِهِ وَرَأَى أَنَّهُ إنْ قَطَعَهُ وَنَزَلَ فَاتَتْ مَصْلَحَتُهُ فَكَانَ ذَلِكَ عِنْدَهُ مِنْ الْحَاجَاتِ الَّتِي يَجُوزُ فِيهَا الْجَمْعُ فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَجْمَعُ بِالْمَدِينَةِ لِغَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ بَلْ

لِلْحَاجَةِ تَعْرِضُ لَهُ كَمَا قَالَ: " أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ ".[١]

ئەوە عبدالله ی کوڕی عەباسە لە کاتی سەفەرو باران دا نییە، وە ئەوەی ڕیوایەتی دەکات دەیکات بە بەڵگە لەسەر کارەکەی، ئەو کۆکردنەوەنوێژەی دەیگێڕێتەوە بۆ کاتی باران نەبووە، وە ابن عباس لە کارێکی گرنگی موسوڵمانان دا بووە ووتاری بۆ داون بۆ ئەو کارانەی پێویستیان بە شارەزایی بووە، ڕای وابووە گەر ووتارەکە بپچڕێنێت ئەو پێویستی و سوودمەندانەیان لەدەست دەردەچێت، ئەمە بەلای ئەوەوە یەکێکە لەو پێویستیانەی دروستە نوێژی بۆ کۆ بکرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نوێژانەی لە مەدینە کۆکردوەتەوە بۆ کاتی ترس و باران نەبووە، بەڵکو بۆ پێویستییەکی لەپێش بوو و کتوپڕ بووە، وەکو دەڵێت: (نەیویستووە موسوڵمانان توشی بارقورسی بن).

(١) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٤٦).

# ووتەو کارەکانی هاوەڵان و تابعین لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ

١- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ قَالَ: «جَمَعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ»(١).

عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه نوێژی نیوەڕۆو عەسری لە ڕۆژێکی باراناوی دا کۆکردەوە.

٢- عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ " كَانَ إِذَا جَمَعَ الْأُمَرَاءَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ جَمَعَ بِهِمْ فِي لَيْلَةِ الْمَطَرِ "(٢).

نافع دەڵێت: عبداللە ی کوڕی عومەر رضي الله عنهما ئەگەر ئەمیرەکان نوێژی مەغریب وعیشایان کۆکردایەتەوە لەگەڵیان نوێژی دەکرد.

٣- عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ أَهْلَ الْمَدِينَةِ كَانُوا يَجْمَعُونَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي

---

(١) عبدالرزاق في المصنف (٤٤٤٠).

(٢) عبدالرزاق في المصنف (٤٤٣٨، ٤٤٣٩)، ومالك (١/ ١٤٥، ٦٢٩)، وابن أبي شيبة (٢/ ٢٣٤)، والبيهقي في الكبرى (٣/ ١٦٨)، وفي الصغرى (٥٨٧)، ومعرفة السنن (٦٢٤٩)، وابن المنذر في الأوسط (٢/ ٤٣٠، ١١٥٧)، كما في الإرواء (٥٨٣)، وجامع الأصول (٤٠٤٦) اسناده صحيح.

اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ، فَيُصَلِّي مَعَهُمْ ابْنُ عُمَرَ لَا يَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ[١].

نافعی کوڕی عبدالله دەڵێت: خەڵکی مەدینە ئەگەر نوێژی مەغریب و عیشایان کۆکردایەتەوە لە شەوێکی باراناوی دا عبدالله ی کوڕی عومەر لەگەڵیان دا دەیکردو ڕەخنەی لێ نەدەگرتن.

٤- قالَ ابنْ الْمُنْذِرْ وَفَعَلَ ذَلِكَ (أي: الجمع في الحضر) أَبَانُ بْنُ عُثْمَانَ وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ وَأَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَمَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ وَعُمَرُ بْنُ عبدالْعَزِيز[٢].

ابن المنذر دەڵێت: ئەوانەی لێیانەوە دەگێڕنەوە نوێژیان بە کۆکردنەوە کردووە لە ماڵەوە بۆ کاتی باران ئەو هاوەڵ و تابیعییانەیە ناویانی بردووە.

وە (هیشامی کوڕی عوروە) دەڵێت: بینیم أبانی کوڕی عثمانی کوڕی عفان نوێژی مەغریب و عیشای کۆکردەوە لە شەوێکی باراناوی دا، وە عوروەی کوڕی زوبێرو أبو سلمە ی کوڕی

---

(١) عبدالرزاق في المصنف (١٤٤١)، بدائع الفوائد لإبن القيم (٤/ ٩٠).

(٢) الأوسط (٢/ ٤٣١)، والتمهيد لإبن عبد البر (١٢/ ٢١١).

عبدالرحمن و أبوبكری كوڕی عبدالرحمن ی لـەگەڵ دا نوێژیان كردو دژایەتییان نەكرد[١].

وە موسای كوڕی عەقبە دەڵێت: عومەری كوڕی عبدالعزیز نوێژی مەغریب و عیشای بە كۆكردنەوە دەكرد گەر باران بوایە و سەعیدی كوڕی موسەیەب و عوروەی كوڕی زوبێرو ئەبوبكری كوڕی عبدالرحمن و پیاوە بەتەمەن و گەورەكان نوێژیان لـەگەڵ دا دەكردن و دژایەتییان نەدەكرد[٢].

٥- (عمل أهل المدينة) كارپێكردن و كۆدەنگی دانیشتوانی مەدینە بەڵگەیە لای ئیمامی مالك و هەندێ لە زانایان[٣].

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٢/ ٢٣٤)، عون المعبود (٤/ ٧٨)، شرح السنة (٤/ ١٩٨)، معرفة السنن (٤/ ٣٠١)، التمهيد (١٢/ ٢١١)، الإستذكار (٦/ ٣١)، والإرواء (٣/ ٤٠) وقال الألباني سنده صحيح.

(٢) معالم السنن (١/ ٢٦٤)، الإرواء (٣/ ٤٠) وقال الألباني سنده صحيح.

(٣) ابن القيم لە زاد المعاد دا (١/ ٢٥٣) دەڵێت: وَعَمَلُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ الَّذِي يُحْتَجُّ بِهِ مَا كَانَ فِي زَمَنِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ، وَأَمَّا عَمَلُهُمْ بَعْدَ مَوْتِهِمْ وَبَعْدَ انْقِرَاضِ عَصْرِ مَنْ كَانَ بِهَا فِي الصَّحَابَةِ، فَلَا فَرْقَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَمَلِ غَيْرِهِمْ، وَالسُّنَّةُ تَحْكُمُ بَيْنَ النَّاسِ. كاری خەڵكی مەدینە كاتێك دەكرێتە بەڵگە كە لە سەردەمی (خەلیفەی ڕاشدین)دا بێت و بەڵام كاری دوای ئەوان و كۆتا سەردەمی ئەوانەی لە صەحابە مابوون جیاواز نییە لەگەڵ شوێنێكی تردا، بەڵكو =

وە ئیمامی خەتتابی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (وقد اختلف الناس في جواز الجمع بين الصلاتين للممطور في الحضر فأجازه جماعة من السلف، روي ذلك عن ابن عمر وفعله عروة وابن المسيب وعمر بن عبد العزيز وأبو بكر بن عبد الرحمن وأبو سلمة وعامة فقهاء المدينة وهو قول مالك والشافعي وأحمد)[(١)].

جیاوازی لە نێوان زانایان دا هەیە لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ بۆ کاتی باران لە شوێنی نیشتەجێبوون دا، کۆمەڵێك لە (سەلەف) هاوەڵان ڕێگەیان پێ داوە وەکو (عبداللە ی کوڕی عومەر و عوروە و سەعیدی کوڕی موسەییەب و عومەری کوڕی عبدالعزیز و أبو بکرو أبو سلمە و گشت زانایانی شاری مەدینە، وە ئەمە ڕای ئیمامی (مالکی و شافعی و أحمد)ە.

وەلیدی کوڕی موسلیم دەڵێت: پرسیارم لە ئیمامی ئەوزاعی کرد لەسەر کۆکردنەوەی نوێژی مەغریب و عیشا لە شەوی باران دا، فەرمووی: (أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَجْمَعُونَ بَيْنَهُمَا) خەڵکی مەدینە هەردوو

= (حدیث) سوننەت یاسایە لە نێوان خەڵك دا. (کۆکردنەوەی نوێژیش کاری سەردەمی صەحابەیە).

(١) معالم السنن (١/ ٢٦٤).

نوێژەکەیان کۆ دەکردەوە[(١)].

وە زانای ناودار (ابن المنذر) لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ لەکاتی باران دا دەڵێت: (وَهُوَ أَمْرٌ مَشْهُورٌ بِالْمَدِينَةِ مَعْمُولٌ بِهِ فِيهَا)[(٢)].

ئەوە کارێکی ئاشکراو بڵاو بووە لە مەدینە داو کاری پێ کراوە.

بەم شێوەیە زانیمان فەرموودەکانی کۆکردنەوەی نوێژ(صحیح)ن، وە کاری مەدینەش پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ زیاتر ڕوون تێگەیشتنی فەرموودەکان وەکو خۆی بە تێگەیشتنی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بەبێ هیچ ناکۆکییەك و ڕەت دانەوەی ناو خۆیان.

باسی ئەوەشمان کرد لە کاتەکانی نوێژ دا (لە قورئان دا کاتەکانی نوێژ بە دوو شێوە دارِشتن دارێژراوە)، ئەمە هێمایەکە بۆ کۆکردنەوەی نوێژ لە قورئان دا وەکو لەم ئایەتە دا ئەو نوێژانەی کۆدەکرێنەوە بەسەر یەکەوە ناوی بردوون: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ . [الإسراء : ٧٨].

نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشا.

(١) الأوسط (٢/ ٤٣٢).

(٢) الإستذكار (٦/ ٣١).

# ووتەو ڕای زانایان

۞ ئیمامی نەوەوی رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (وذهب جماعة من الأئمة إلى جواز الجمع في الحضر للحاجة، لمن لا يتخذه عادة، وهو قول ابن سيرين وأشهب وحكاه الخطابي: عن القفال والشاشي الكبير والمروزي وعن جماعة من أصحاب الحديث واختاره ابن المنذر ويؤيده ظاهر قول ابن عباس: أراد أن لايخرج أمته فلم يعلله بمرض ولا غيره والله أعلم)[١].

کۆمەڵێك لە زانایان ڕایان لەسەر دروستی کۆکردنەوەی نوێژ هەیە لە شوێنی نیشتەجێبوون دا بەمەرجێك بەردەوام نەیکەن، ئەمە ڕای محمدی کوڕی سیرین و ئەشهەب لە مالیکییەکان، وە ئیمامی خەتابی لە زانایانی وەك قەفال و شاشی گەورە لە شافعییەکان و ئیمامی مروزی و هەندێك لە کۆمەڵە زانایانی حەدیسەوە دەیگێڕنەوەو ئیمامی

(١) شرح مسلم (٥/ ٢٤ رقم "١٦٢٦")، معالم السنن للخطابي (١/ ٢٦٥)، الأوسط (٢/ ٢٣٣)، روضة الطالبين (١/ ٤٠١)، البحر الزخار (٢/ ١٦٩)، فتح الباري لإبن حجر (٢/ ٢٤)، منهاج الطالبين للنووي (١/ ٤٦).

ئەبو مونزیریش ئەم ڕایەی هەیە.

ڕووکەشی قسەکەی (ابن عباس) پشتگیریان دەکات کە دەڵێت: (أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ) نەیبەستوەتەوە بە هیچ هۆکارێکەوە، نە بە نەخۆشی نە بە هیچی تر.

❁ ئیمامی شافعی رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمویێت: (ولا يكون لأحد أن يجمع بين الصلاتين في وقت الأولى منهما إلا في مطر)[(١)].

کۆکردنەوەی نوێژ بۆ هیچ کەسێك نییە بێجگە لەکاتی باران دا نەبێت.

کۆکردنەوەی نوێژ لە مەزهەبی شافعی دا لە مزگەوت دەکرێت بۆ کاتی باران[(٢)].

وە هەروەها لە مەزهەبی مالیکیش دا دروستە کۆکردنەوەی نوێژ بۆ کاتی باران بۆ شوێنی نیشتەجێبوون[(٣)].

❁ وە ئیمامی خەتابی رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: کۆکردنەوەی نوێژ لەکاتی باران

---

(١) الأم (١/ ٩٩)، منهاج الطالبين (١/ ٤٦)، مغني المحتاج (١/ ٥٣٣).

(٢) مختصر المذني (٢٥)، الأوسط (٢/ ٤٣٢)، الإقناع (٤٨)، الحاوي الكبير (٢/ ٤٥٠)، روضة الطالبين (١/ ٣٩٩)، المجموع (٤/ ٣٧١).

(٣) المدونة (١/ ١١٠).

دا ڕای (وهو قول مالك والشافعي وأحمد)ە رحمهم الله تعالى[(١)].

۞ ابن رشد رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (فأجازه الجمهور)[(٢)].

زانایان کۆدەنگن لە کۆکردنەوەی نوێژدا، بێجگە لە مەزهەبی (أبو حنيفة) نەبێت مەزهەبی شافعی و مالیکی و حەنبەلی ڕایان لەسەر کۆکردنەوەی کۆن بە هەندێ وردەکاری و جیاوازی لە چۆنیەتی کردنی دا، لەسەر بەڵگەی ڕیوایەتەکانی عبدالله ی کوڕی عباس[(٣)].

۞ ابن تيمية رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموێت: (فحديث ابن عباس في الجمع بالمدينة صحيح من مشاهير الصحاح... ومما يبين أن ابن عباس لم يرد الجمع للمطر وإن كان الجمع للمطر أولى بالجواز... فهذه الآثار تدل على أن الجمع للمطر من الأمر القديم المعمول به بالمدينة زمن الصحابة والتابعين مع أنه لم ينقل أن أحداً من الصحابة والتابعين أنكر ذلك فعلم أنه منقول عندهم بالتواتر جواز ذلك)[(٤)].

---

(١) معالم السنن (١/ ٢٦٤)، الإرواء للألباني (٣/ ٤٠). (٢) بداية المجتهد (١/ ١٨١).

(٣) نهاية المحتاج (٢/ ٢٨٠)، الروض المربع (١/ ٩٠)، تحفة المحتاج (٢/ ٢٨٠)، الإشراف (١/ ٤٠٢).

(٤) مجموع الفتاوى لإبن تيمية (٢٤/ ٤٢-٥٠).

فەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی عباس لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ لە مەدینەدا لە فەرموودە (صحیح)ە ناودارەکانە، وە ئەوەی ڕوون بێت لە ئیبن عباسەوە مەبەستی پێی کۆکردنەوەی نوێژ نەبووە بۆ باران، گەرچی کۆکردنەوەی نوێژ لەپێش ترە بۆی، ئەم فەرموودانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆکردنەوەی نوێژ بۆ باران کارێکی کۆنی کارپێکراوی شاری مەدینەیە لەسەردەمی (صحابە و تابعین) دا، لەگەڵ ئەوەش دا هیچ کەسێك لە (صحابە و تابعین) دژایەتی نەکردووە، بەم پێیە دەزانرێت لەوانەوە بەژمارەی ڕەهای زۆریان دروست بونیەتی.

۞ وە هەروەها ابن القيم رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (أن دليل الجمع للمطير ما رواه نافع: كان أهل المدينة إذا جمعوا بين المغرب والعشاء صلى معهم ابن عمر وروى عن ابن الزبير مثله)(١).

بەڵگەی کۆکردنەوەی نوێژ (نافع) دەڵێت گەر خەڵکی مەدینە نوێژی مەغریب و عیشایان کۆکردایەتەوە عبدالله ی کوڕی عومەر لەگەڵیان دا دەیکرد، وە هەروەها لە عبدالله ی کوڕی زوبەیریشەوە دەگێڕنەوە.

---

(١) بدائع الفوائد (٤/ ١٠٢).

وە لە (زاد المعاد) بە درێژی پێداگری لە كۆكردنەوەی نوێژ دەكات[(١)].

❁ وە أحمد شاكر رَحِمَهُ اللَّهُ لە شەرح كردنی (سنن الترمذي) دا دەڵێت: (وهذا هو الصحيح الذي يؤخذ من حديث ابن عباس)[(٢)].

ئەوە ڕای ڕاست و دروستە لە فەرموودەكەی (ابن عباس) وەردەگیرێت.

❁ وە ئیمامی الترمذي رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (وقال بعض أهل العلم بجمع بين الصلاتين في المطر وبه يقول الشافعي وأحمد واسحاق)[(٣)].

ڕای هەندێك لە زانایان لەسەر كۆكردنەوەی نوێژە لەكاتی باران دا وەكو ئیمامی شافعی و ئیمام أحمد و أبو اسحاقی كوڕی ڕاهویە.

❁ شێخ ئەلبانی رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (فائدة: واعلم أن حديث ابن عباس يدل على جواز الجمع في الإقامة لرفع الحرج وليس مطلقاً

---

(١) زاد المعاد (١/ ٤٥٩). (٢) سنن الترمذي – شرح وتحقيق أحمد شاكر (١/ ٣٥٨).

(٣) سنن الترمذي (١/ ٢٥٩– رقم ١٨٨)، والفقه على مذاهب الأربعة (١/ ٤٣٨).

فتنبه لهذا فإنه هام)[١].

بزانە فەرموودەی عبداللە ی کوڕی عباس دەبێتە بەڵگە لەسەر دروستی کۆکردنەوەی نوێژ لە شوێنی نیشتەجێبوون دا بۆ کارئاسانی و نەمانی کارقورسی، ئەم کارئاسانییە (رخصة) ڕەها نییە ئاگادار بە ئەمە گرنگە. واتە: بەس بۆ کاتی زۆر پێویست دەکرێت.

۞ وە شێخ العثیمین رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (فحاصل القاعدة فيه: أنه كلما لحق الإنسان مشقة بترك الجمع جاز له الجمع حضراً وسفراً)[٢].

کورتەی بنەما یاساییەکەی ئەوەیە: هەرکاتێك ئادەمیزاد توشی ئەرك و کارقورسی بوو بەهۆی نەکردنی کۆکردنەوەی نوێژەوە، ئەوا دروستە کۆکردنەوەی لە شوێنی نیشتەجێبوون یاخود لە سەفەردا بێت.

۞ ابن قدامة المقدسي رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (يجوز الجمع لأجل المطر بين المغرب والعشاء ويُروى ذلك عن ابن عمر وفعله أبان بن عثمان في أهل المدينة، وهو قول الفقهاء السبعة، ومالك والأوزاعي

---

(١) سلسلة الضعيفة (٣/ ٣٥٨) تحت رقم (١٢١٣).

(٢) الشرح المتمع (٤/ ٣٩١).

والشافعي واسحاق وروى عن مروان وعمر بن عبدالعزيز)[١].

دروستە کۆکردنەوەی نوێژ بە هۆکاری باران، ئەمە گێڕدراوەتەوە لە عبداللە ی کوڕی عومەرو ئەبانی کوڕی (عثمان بن عفان) بۆ خەڵکی مەدینە، ئەمە ڕای حەوت فەقیهەکەی مەدینە و ئیمامی مالیك و ئەوزاعی و شافعی و ئیسحاقەوە لە مەروان و عومەری کوڕی عبدالعزیز دەگێڕنەوە.

۞ وە ئیمامی الشنقيطي رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (والذي يظهر والعلم عند الله مشروعية الجمع، سواء أكان جمع تقديم أو جمع تأخير، والسنة في ذلك صحيحة وثابتة عن النبي ﷺ فقد جمع ﷺ بين الظهر والعصر وبين العشائين جَمَعَ جَمعُ تقديم و جَمَعَ جَمعُ تأخير... وهذا القول الذي يقول بمشروعية الجمع مذهب الجمهور)[٢].

ئەوەی ئاشکرایە ڕێگە پێدانی کۆکردنەوەی نوێژە ئەگەر کۆکردنەوەی پێشخستن بێت یاخود دواخستن، بەڵگەی سوننەتی (صحيح)ی لەسەرە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژی نیوەڕۆ عەسرو

(١) المغني (٣/ ٢٠٢)، وفقه السنة (١/ ٢٩٠).

(٢) شرح زاد المستقنع لمحمد بن محمد المختار الشنقيطي "صاحب أضواء البيان" (٣/ ٦٧).

مەغریب و عیشا بە پێش خستنی و دواخستنی کاتەکانی، ئەمە ڕای زۆری زانایانە لـەسەر ڕێگەپێدانی.

۞ وە شێخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز ﷾ دەڵێت: (فالأمر فيه واسع، وقد دل الشرع على جوازه في وقت الأولى والثانية أو بينهما لأن وقتهما صار وقتاً واحداً...) [(١)].

لە کـۆکردنەوەی نوێژ دا کار تیای دا فراوانە، بەڵگەی شەرعیمان هەیە لـەسەر دروستی لـەکاتی یەکەم و دووەم دا، یاخود لـە نێوانیان دا، لـەبەر ئەوەی کاتی هەردووکیان یەك کاتە.

وە زانایانەی (فەرموودە ناس)یش لـە کتێبی فەرموودەکان دا لـەسەر فەرموودەکانی (ابن عباس) سەردێڕێکی تایبەت بە دروست بوونی کۆکردنەوەی نوێژ ڕازاندوەتەوە، وەك ئیمامی بەیهەقی لـە "سنن الکبری (٣/١٦٦)" دا، هەروەها عبدالرزاق لـە "المصنف (٢/٥٥٢)، وە ئیمامی النسائي لـە "السنن (١/٢٩٠)" وە ابن خزيمة لـە صەحیحەکەی دا (٢/٨٥)، وە هەروەها ئیمامی الترمذي لـە "جامع الترمذي (١/٣٥٤)"، وە أبو عوانة لـە موسنەدەکەی دا (٢/٣٠٣)، وە ئیمامی البغوي لـە "السنة (٤/١٩٢)"... .

---

(١) مجموع فتاوى ابن باز (١/١٠٦)، وفتاوى اسلامية (١/ ٢٩٧).

# حوکمی کۆکردنەوەی نوێژ

حوکمی نوێژ کۆکردنەوە بە هەموو شێوەکانیەوە بۆ کاتی پێویستی و بوونی ڕەچاوی شەرعی تیای دا ڕاو بۆچوونی بەهێز لەناو زانایان دا ڕێگە پێدراوو دروستییە کە پێی دەوترێت (الرخصە والإباحە)، واتە حوکمی سوننەت نادرێت بە سەری دا، لەبەر جیاوازی نێوان (الرخصە والسنە)[١].

۞ ابن تیمیة رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (فليس القصر كالجمع بل القصر سنة راتبة وأما الجمع فإنه رخصة عارضة)[٢].

کورت کردنەوەی نوێژ وەکو کۆکردنەوە نییە، بەڵکو کورت کردنەوە سوننەتێکی بەردەوامە بەڵام کۆکردنەوە ڕێگەپێدراوێکە بۆ کاتی پێویستی.

۞ ئیمامی نەوەوی رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (الأحاديث الواردة في الجمع ليست نصوصاً في الإستحباب، بل فيها جواز فعله ولا يلزم منه الإستحباب)[٣].

---

(١) بڕوانە الموافقات امام الشاطبي (١/ ٤٧٤). (٢) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٢٠).

(٣) الأصول والضوابط للنووي (٣٩).

ئەو فەرموودانەی هاتووە لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ دەق نین لەسەر سوننەتیێتی، بەڵکو حوکم تیایدا دروستیەتی، بەڵگە نین لەسەر سوننەت بوونی.

۞ قاضي العياض ﵀ دەڵێت: (الجمع بين الصلوات المشتركة الأوقات يكون تارة سنة وتارة رخصة، فالسنة الجمع بالعرفة ومزدلفة،ولا خلاف في ذلك، وأما الرخصة فالجمع في المرض والسفر والمطر)[١].

کۆکردنەوەی ئەو نوێژانەی کاتەکانیان بەشدارە هەندێ جار سوننەتەو هەندێ جاریش (رخصة)، سوننەت کۆکردنەوەی نوێژە لە عەرەفەو موزدەلیفە، ئەمە کۆدەنگی زانایانە، بەڵام (رخصة) کۆکردنەوەی نوێژ بۆ نەخۆشی و سەفەر و بارانە.

- **لە مەزهەبی مالکی دا** ﵀: هەروەك ابن عبدالبر ﵀ دەڵێت: (خلاف الأولى إذ الأولى إيقاع الصلاة في وقتها)[٢].

پێچەوانەی لەپێشترە، بەڵکو لەپێشتر ئەوەیە نوێژ لەکاتی خۆی دا

(١) إكمال المعلم (٣/ ٣٠).

(٢) حاشية العدوي (١/ ٩٧)، شرح منح الجليل (١/ ٢٥٠).

بکرێت هەتا دەکرێت.

- **وە لە مەزهەبی شافعی دا** رَحِمَهُ اللَّهُ: نەوەوی دەڵێت: (ترك الجمع أفضل)[١].

- **لە مەزهەبی حەنبەلی دا** رَحِمَهُ اللَّهُ: ابن مفلح دەڵێت: (يجوز الجمع، وتركه أفضل)[٢].

واتە دەتوانرێت بۆ زۆر پێویست نەبێت نەکرێت، وە گەر کراش بە بەردەوامی نەبێت تا بکرێت بە عادەت هەروەکو ابن سيرين و هەندێك دەفەرموون[٣].

پێویستییەکانی کۆکردنەوەی نوێژ یا تاکەکەسین بە هۆکاری ئەوەی نوێژەکە مافی خۆی نادرێتێ یا لەبیری دەچێت یا کاتەکەی دەڕوات و دڵنیایە بۆی ناکرێت، یا پێویستییەکی گشتییە وەك باران و سەرماو باو بومەلەرزە بە هۆکارییەوە نوێژێکی جەماعەت دەڕوات.

ابن تيمية رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (إن الجمع ليس من سنة السفر كالقصر

---

(١) روضة الطالبين (١/ ٤٠٣)، المجموع (٤/ ٣٧٨).

(٢) الفروع (٢/ ٦٨).

(٣) فتح الباري (٢/ ٢٤)، أعلام الحديث للخطابي (١/ ٤٢٧)، شرح صحيح مسلم للنووي (٥/ ٢١٩)، معالم السنن ١/ ٢٦٥)، التمهيد (١٢/ ٢١٥).

بل يفعله للحاجة سواء كان في السفر أو الحضر)[١].

کۆکردنەوەی نوێژ سوننەتی سەفەر نییە وەکو کورت کردنەوە، بەڵکو بۆ کاتی پێویست دەکرێت خۆ ئەگەر لە سەفەردا بێت یاخود ماڵەوە.

شێخ العثيمين رَحِمَهُ اللَّهُ لە ڕووە کردارییەکی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەڵێت (سوننەتە) گەر هۆکاری کردنی هەبوو بەو مانایەی نەکردنی لەو کاتەدا پێچەوانەی سوننەتە، نەك لە ڕووە هەڵسەنگاندنە (فیقهییەکەیەوە).

(والصحيح أن الجمع سنة إذا وجد سببه لوجهين:

الأول: أنه من رخص الله تعالى.

الثاني: أن فيه اقتداء برسول ﷺ فإنه كان يجمع عند السبب المبيح للجمع).الشرح الممتع (٣٨٦٠٤).

دروست ئەوەیە کۆکردنەوەی نوێژ سوننەتە لەبەر دوو هۆکار: هۆکاری ڕێگەپێدراوی (رخصة)، وە شوێنکەوتەیی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

---

(١) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٦٥).

هۆکاری یاسای (رخصة یان الإباحة)دان بەسەر کۆکردنەوەی نوێژدا دەگەڕێتەوە بۆ بارە سروشتییەکەی خۆی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەمی کردوویەتی و ڕیوایەتی کەمیشی لەسەرە بۆ هەموو شێوەکانی.

وەك ابن تیمیة رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (بخلاف الجمع بین الصلاتين فإن النبي ﷺ لم يفعله إلا مرات قليلة فإنهم يستحبون تركه إلا عند الحاجة إليه اقتداءً بالنبي ﷺ حين جد به السير... ولهذا كان أهل السنة مجمعين على جواز القصر في السفر، مختلفين في جواز الإتمام، ومجمعين على جواز التفريق بين الصلاتين، مختلفين في جواز الجمع بينهما)[١].

بەپێچەوانەی کۆکردنەوەی دوو نوێژەوە، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە بێجگە لە چەند کاتێکی کەم نەبێت، زاناکان بەباشی دەزانن نەکرێت بێجگە لەکاتی پێویستی دا هەروەکو پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی لە سەفەری پەلەدا، ئەهلی سوننە کۆن لەسەر کورت کردنەوەی نوێژ لە سەفەردا، بەڵام ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر

(١) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٢٢).

بەتەواوکردنی، وە کۆن لەسەر بەجیا کردنی نوێژەکان لە شوێنەکانی خۆیان دا، بەڵام ڕای جیاوازیان هەیە لە کۆکردنەوەیان دا.

## تێبینییەکان

١) کۆکردنەوەی دوو نوێژ بە یەك بانگ و دوو قامەت ئەنجام دەدرێت.

«بآذان واحد وإقامتين»[١].

٢) کردنی نوێژە سوننەتە ڕاتبەکانی پێش و پاشی فەرزەکان لەکاتی کۆکردنەوە دا.

ئیمامی نەوەوی رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: (والصواب الذي قاله المحققون: إنه يصلي سنة الظهر التي قبلها ثم يصلي الظهر ثم العصر ثم سنة الظهر التي بعدها ثم سنة العصر، وفي جمع العشاء والمغرب يصلي الفريضتين ثم سنة المغرب ثم سنة العشاء)[٢].

ڕای بەهێزو تەواو کە زانایانی شیتەڵکار وتویانە: سوننەتی پێش

---

(١) البخاري (١٠٨)، ومسلم (٦٩٣).

(٢) روضة الطالبين (١/ ٤٠٢)، وفتح الوهاب (١/ ٧٣)، وفتح الجواد (١/ ١٩٦).

نیوەڕۆ دەکرێت پاشان نوێژی نیوەڕۆ پاشان عەسر پاشان سوننەتی پاش نیوەڕۆ پاشان سوننەتی دوای عەسر، وە لە کۆکردنەوەی مەغریب و عیشادا هەردوو فەرزەکە دەکرێت و پاشان سوننەتی دوای مەغریب و سوننەتی دوای عیشا.

بەهەمان شێوە ابن قدامة المقدسي رحمه الله دەڵێت: (فله أن يصلي سنة الثانية منها قبل دخول وقت الثانية)[1].

نوێژی سوننەتی دووەم نوێژ دەکرێت پێش ئەوەی بچیتە کاتەکەیەوە.

٣) نوێژی وەتر کاتەکەی لەدوای نوێژی عیشاوە دەست پێ دەکات، نەك لەدوای بانگی عیشاوە، ئەمە ڕای زۆری زانایانە[2]. ئەگەر بێت و لەگەڵ مەغریب دا کۆکرابێتەوە، ئەوا دوای نوێژی عیشا کە کاتی مەغریبە دەتوانرێت نوێژی وەتر بکرێت، وەك ئەم یاسا فیقهییە دەڵێت: (الأصل بقاء ما كان على ما كان عليه حتى يأتي دليل آخر). واتە ئەصڵ لە کارەکان دا مانەوەیانە وەکو خۆیان

---

(١) المغني (٢/ ١٢٥).

(٢) نيل الأوطار (١/ ٢٥٤)، روضة الطالبين (١/ ٤٠٢)، المغني لإبن قدامة (٢/ ١٢٥)، فتح الباري (٣/ ٥١) كتاب التجهد.

تاوەکو بەڵگەی تر دێت لەسەری.

٤) کۆکردنەوەی نوێژی جومعەو عەسر: لەسەر ئەم بابەتە ڕای جیاواز لەنێوان زانایان دا هەیە:

ئیمامی نەوەوی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (يجوز الجمع بين صلاة الجمعة والعصر للمطر، إن أراد تأخير الجمعة إلى وقت العصر جاز إذا جوزنا تأخير الظهر، فيخطب في وقت العصر ويصلي)[١].

دروستە نوێژی جومعەو عەسر بۆ باران کۆبکرێتەوە، گەر جومعە دوابخرێت بۆ کاتی عەسر دروستە، وەکو دروستە نیوەڕۆ دوا بخرێت، لەکاتی عەسردا وتاری هەینی دەدرێت و نوێژ دەکرێت.

شێخ مشهور حسن لە کتێبی (فقه الجمع بين الصلاتين ص٢٧٧) دەڵێت: (وأما إذا أديت الجمعة بعد الزوال... فيجوز الجمع بينهما ونص على هذا الشافعية وهو وجه المحتمل عند الحنابلة وبه كان يفتي شيخنا الألباني رحمه الله).

ئەگەر نوێژی جومعە پێش بانگی نیوەڕۆ کرا[٢] ئەوا کۆ ناکرێتەوە

(١) روضة الطالبين (١/ ٤٠٠).

(٢) نوێژی جومعە دوو کاتی هەیە لە سوننەت دا: پێش بانگی نیوەڕۆو دوای بانگ.

لەگەڵ عەسر دا بەڵام لەدوای بانگی نیوەڕۆ کرا ئەوا بۆ کاتی پێویست کاتی لەگەڵ کاتی عەسردا یەکێکەو دروستە لەگەڵ نوێژی عەسردا کۆبکرێتەوە، ئەمە ڕای شافعییەکانە و ڕویەکە لە ڕاکانی حەنبەلییەکان، وە بە دروست کۆکردنەوەی نوێژی جومعەو عەسر شێخ ئەلبانی فەتوای دەدا.

لەبەرامبەر ئەم بۆچوونەدا ڕای بەهێزی مەزهەبی حەنبەلییە خاوەنی (الإقناع في فقه الإمام أحمد) دەڵێت: (لا تجمع في محل يبيح الجمع)[1].

جومعە کۆناکرێتەوە لەگەڵ نوێژی تردا.

وە هەر ئەم ڕایە شێخ (العثيمين) بەهێزی دەکات و دەڵێت: (لا تجمع العصر إلى الجمعة لعدم ورود ذلك في السنة ولا يصح قياس ذلك على جمعها إلى الظهر للفروق الكثيرة بين الجمعة والظهر... وأنه لا قياس في العبادة... أن الجمعة صلاة مستقلة منفردة بأحكام تفترق مع الظهر بأكثر من عشرين حكماً وهذه الفروق نمتنع أن تلحق إحدى الصلاتين بالأخرى... وقد وقع المطر الذي فيه المشقة في عهد النبي ﷺ ولم يجمع فيه بين العصر والجمعة. وأن الأصل في

(١) الإقناع لموسى الحجاوي (١/ ١٨٩)، وكشف القناع للبهوتي (٢/ ٢١).

العبادات المنع إلا بدليل (ما الدليل على جوازه؟) فلا يطالب من منع التعبد لله تعالى بشيء من الأعمال الظاهرة أو الباطنة، وإنما يطالب بذلك من تعبد به)[١].

(وكذلك قال الشيخ ابن باز رحمه الله: فإنه لا يجمع إليها العصر...)[٢].

نوێژی عەسر نابرێت بۆلای نوێژی جومعە بە کۆکردنەوە لەبەر نەبوونی بەڵگەی سوننەت لەسەری، وە (قیاس)یش لەسەری ناکرێت لەبەر ئەوەی (قیاس) لە عیبادات دا نییە، وە نوێژی جومعە سەربەخۆیەو تاکەو جیاوازە لە نیوەڕۆ بە زیاد لە بیست حوکم، ئەم جیاوازیانە هۆکارە ئەم دوو نوێژە بگەیەنرێت بە یەك، لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ باران باریوە هۆکاری ئەرك بووە لەگەڵ ئەوەش دا کۆ نەکراوەتەوە لەگەڵ عەسردا، وە ئەصڵ و بناغە لە عیبادات دا نەکردنەو ڕێلێگرتنە بێجگە لە بوونی بەڵگە نەبێت (چ بەڵگەیەك هەیە لەسەر دروستی؟) داوای بەڵگە لە کەسێك ناکرێت کە ڕێگر بێت لە

(١) مجموع فتاوى ورسائل (١٥/ ٣٦٩–٣٧٨)، الشرح الممتع (٤/ ٤٠٢).

(٢) مجموع فتاوى ابن باز (٣٠/ ٢١٥) رقم ٥٩.

کردنی عیبادەتێکی ناوەڕۆکی یا دەرەکی، بەڵکو داوای بەڵگە لە کەسێك دەکرێت عیبادەتی پێ بکات. (ئەمە یاسایەکی ئوسولّییە).

وە هەروەها شێخ (ابن باز)یش هەمان ڕای هەیە.

ئەم بابەتە شوێنی بیرو ڕای زانایانە (محل الإجتهاد)، وە هیچ بەڵگەیەکی (الصریح والصحیح)مان نییە بۆ یەکلابوونەوەی بێجگە لە تێگەیشتن و نزیکبونەوەی لە ماناو مەبەست و هاوشێوە یاساکانی شەرع نەبێت، ئەمەش شایانی وەرگرتن و ڕەت دانەوەیە، وە کارکردن لەسەر ڕایەك نابێت ببێتە هۆی دژایەتی و دووبەرەکایەتی.

بەڵام بێگومانین حیکمەت و هۆکاری خوێندنەوەی شەرع بۆ ئەم بابەتە زانای ئەم گەلە عبداللە ی کوڕی عباس خوی شایەتحاڵی کارەکەی پێغەمبەر بووە ﷺ، وە هەر ئەویش دەربڕین و داڕشتنی بۆ داوەتەوە (کي لا یحرج أمته، أراد أن لا یحرج أمته) تاوەکو ئومەتەکەی توشی ئەرك گرانی و ناڕەحەتی نەبن.

بە ڕێلێگرتن لەم کۆکردنەوەیەی (عەسرو جومعە) بە دڵنیایی هۆکاری بار قورسی و ناڕەحەتی دەبێت، لەبەر ئەوەی ئەم کۆکردنەوەیە پێویستە بە دڵنیاییەوە تا ڕادەیەکی زۆر نوێژی عەسری دەکەوێتە مەترسی کەوتنە کاتی مەغریبەوە، ئەم کارەش پێچەوانە

(مخالفة)ی شەرعی زیاترە تاوەکو کەوتنە (مخالفة)ی کۆکردنەوەی لەگەڵ جومعەدا.

گەر (مسافر) ڕێگەی پێبدرێت نوێژی (جومعە) نەکات «ليس على مسافر جمعة»[1] لەبەر کارئاسانی و نەهێشتنی قورسایی، ئەوا ڕێگرتن لە کەسێك نوێژی (جومعە) دەکات و لەگەڵ عەسردا کۆیدەکاتەوە ئەستەمە.

وە لەلایەکی تریشەوە (عدم الدليل ليس دليل عدم)[2] نەبوونی بەڵگە بەڵگە نییە لەسەر نەبوون.

٥) نمونەی چەند کاتێك نوێژی تێدا کۆدەکرێتەوە:

أ. **سەفەر:** لە سەفەردا بۆ ڕێگە دەکرێت تا گەیشتنی بە شوێنەکە، لەوێدا بۆ کاتی پێویست دەکرێت، وەکو لە سەفەری حەج دا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگادا کردوویەتی، وە لە مینا دا نەیکردووە لەپێش حەج و دوای حەج دا کە هەر لە سەفەردا بوون، بەڵام لە عەرەفەو موزدەلیفەدا کردوویەتی، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

(١) صحيح الجامع الصغير (٥٤٠٥)، الإرواء (٥٩٤). (٢) مجموع الفتاوى (٦/ ٦٢٤).

وَسَلَّمَ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ، إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ وَيَجْمَعُ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ»[١].

ب. **بۆ نەخۆش:** نەخۆش لەکاتی نەتوانین و پێویستی دا دەتوانێت نوێژەکان کۆ بکاتەوە، لەسەر ڕیوایەتەکەی (ابن عباس): «أراد أن لا يحرج أمته» بۆ لابردنی قورسی و بارگرانی لەسەر ئوممەتەکەی، لەبەر ئەوە بارگرانییەکی تەواوە لەسەر نەخۆش بەگشتی، بێجگە لە نەخۆشییەك توانای هەڵسوکەوتی لەگەڵدایە، زانایانیش لەسەر ئەم ڕایەن وەك: (ابن الحجر، ابن تيمية، نووي...)[٢].

ج. **بەفرو بای ساردو بەهێزو قوڕو چڵپاو:** کە هۆکار بێت لە نەتوانینی چوون بۆ مزگەوت و لەدەست چوونی نوێژی جەماعەت، وە گەر ڕێگاکەشی قیرتاوو کۆنکرێت بێت بە هۆکاری سەرماو سۆڵەوە بێت هەر دروستە کۆکردنەوەی

---

(١) البخاري (١١٠٧)، ورواية ابن عمر رضي الله عنهما (١١٠٦)، ومسلم (٧٠٣).

(٢) فتح الباري (٢/ ٢٤)، شرح مسلم للنووي (٥/ ٢٢٥)، مجموع الفتاوى (٢٤/ ٥٨)، المغني لإبن قدامة (٣/ ١٣٥).

نوێژەکان[(١)].

ابن تیمیة رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (يَجُوزُ الْجَمْعُ لِلْوَحْلِ الشَّدِيدِ وَالرِّيحِ الشَّدِيدَةِ الْبَارِدَةِ فِي اللَّيْلَةِ الظَّلْمَاءِ وَنَحْوِ ذَلِكَ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ الْمَطَرُ نَازِلًا فِي أَصَحِّ قَوْلَيْ الْعُلَمَاءِ وَذَلِكَ أَوْلَى مِنْ أَنْ يُصَلُّوا فِي بُيُوتِهِمْ بَلْ تَرْكُ الْجَمْعِ مَعَ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ بِدْعَةٌ مُخَالِفَةٌ لِلسُّنَّة... وَالصَّلَاةُ جَمْعًا فِي الْمَسَاجِدِ أَوْلَى مِنْ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ مُفَرَّقَةً بِاتِّفَاقِ الْأَئِمَّةِ الَّذِينَ يُجَوِّزُونَ الْجَمْعَ: كَمَالِكٍ وَالشَّافِعِيِّ وَأَحْمَد)[(٢)].

دروستە کۆکردنەوەی نوێژ بۆ قوڕاوێکی زۆرو بایەکی بەهێزی ساردو شەوێکی تاریك...، ئەمانە گەر بارانیش نەبارێت لەسەر ڕای بەهێزی زانایان لەپێش ترە تاوەکو نوێژەکانیان لەماڵەوە بکەن، نەکردنی کۆکردنەوەی نوێژەکان (بە جەماعەت) لە مزگەوت و کردنی نوێژەکان لە ماڵەوە بەبێ هاتن بۆ مزگەوت داهێنراوەو (بدعة) پێچەوانەی سوننەتە، لەسەر ڕای کۆی گشتی ئەو زانایانەی ڕێگە بە کۆکردنەوەی نوێژ دەدەن وەك: ئیمامی مالك و شافعی و أحمد.

---

(١) الشرح الممتع (٤/ ٣٩٤). تەنانەت دەڵێت گەر سەرگیراو بێت ڕێگای مزگەوتیش.

(٢) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٢١)، الشرح الممتع (٤/ ٣٩٢).

د. **(المستحاضة) خوێنی نەخۆشی لە ئافرەتان دا:** گەر ئافرەتێك لەدوای ماوەی سوڕی مانگانە خوێنی بەردەوام بوو ئەوە خوێنی نەخۆشییە، دوو ڕێگا هەیە:

١. هەموو نوێژێك خۆی پاك بكاتەوە و دەستنوێژ بگرێت و نوێژەکان لەکاتی خۆی دا بکات.

٢. وە ڕێگەی دووەمیش کۆکردنەوەی نوێژە، دەتوانێت خۆی بشوات بۆ هەموو دوو نوێژێك و بە کۆکراوەیی بیانکات، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە (حمنە ی کچی جحش) «تَغْتَسِلِينَ حِينَ تَطْهُرِينَ، وَتُصَلِّينَ الظُّهْرَ وَالعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ تُؤَخِّرِينَ الْمَغْرِبَ، وَتُعَجِّلِينَ العِشَاءَ، ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ، وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ، فَافْعَلِي، وَتَغْتَسِلِينَ مَعَ الصُّبْحِ وَتُصَلِّينَ، وَكَذَلِكِ فَافْعَلِي»[١].

خۆت بشۆ نوێژی نیوەڕۆ عەسر بە کۆکراوەیی بکە، وە مەغریب بخەرە لای عیشاو خۆتی بۆ بشۆ بە کۆکراوەیی بیان کە، وە بۆ بەیانیش خۆت بشۆ نوێژی بەیانی بکە.

---

(١) الترمذي (٤٩٢)، وابن ماجة (٦١٨)، وأبوداود (٢٤٨)، وأحمد (٢٨٤٨٥،٢٨٨٨).

٦) ئەو مەرجانەی دانراوە بۆ کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە (وجود العذر، الترتيب، الموالاة، النية...) بەڵگەیان لەسەر نییە بێجگە لە (العذر) نەبێت.

وەکو شێخ (عبد الرحمن ناصر السعدي) ﷀ دەڵێت: (والصحيح جواز الجمع إذا وجد العذر ولا يشترط غير وجود العذر لا موالاة ولا نية).

وە ابن تيمية ﷀ دەڵێت: (وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا كَانَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ جَمْعًا وَقَصْرًا لَمْ يَكُنْ يَأْمُرُ أَحَدًا مِنْهُمْ بِنِيَّةِ الْجَمْعِ وَالْقَصْرِ... وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لَا تُشْتَرَطُ الْمُوَالَاةُ)[(١)].

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە هاوەڵانی کردووە فەرمانی نەداوە بە کەس نییەتی کۆکردنەوەو کورت کردنەوە بێنێت... وە مەرجی بەدوای یەکدا کردنیشی نییە.

وە هەروەها شێخ (العثيمين) ﷀ لە (الشرح الممتع)دا[(٢)] بەهەمان شێوەی ابن تيمية ﷀ باس دەکات.

(١) مجموع الفتاوى (٢٤/ ٣٢).

(٢) الشرح الممتع (٤/ ٣٩٧-٤٠٧).

٧) عن ابن عباس، عن النبي ﷺ قال: «من جمع بين الصلاتين من غير عذر، فقد أتى بابا من أبواب الكبائر»[١] (ضعيف جداً ومنكر).

هەركەسێك دوو نوێژ كۆبكاتەوە بەبێ پاساو گەیشتوتە دەرگایەك لە دەرگاكانی تاوانە گەورەكان.

ئەمە ووتەی عومەری كوڕی خەتتابە ﷺ لە نامەیەك دا بۆ ئەمیرەكانی نوسیوە: (ثَلَاثٌ مِنْ الْكَبَائِرِ: الْجَمْعُ بَيْنَ صَلَاتَيْنِ إلَّا مِنْ عُذْرٍ وَالْفِرَارُ مِنْ الزَّحْفِ وَالنَّهْبُ). مجموع الفتاوى (٢٤/ ٥٠).

سیان لە تاوانە گەورەكانە: كۆكردنەوەی نوێژ بەبێ پاساو، ڕاكردن لە ڕۆژی شەڕ دا، تالآنی.

ئیمامی عومەر خۆی نوێژی كۆكردوتەوە لە ڕۆژی باران دا[٢].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ اسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

(١) الضعيفة (٤٥٨١)، ضعيف الجامع الصغير (٥٥٦٤)، ضعيف الترمذي (١٣٨)، ذكر ابن الجوزي في الموضوعات (٢/ ١٠١)، وضعفه البيهقي في سننه (٣/ ١٦٩)، والدارقطني في الضعفاء ص٣٨، وضعفه ابن عبدالبر في التمهيد (٣/ ١٩/ ٢).

(٢) مصنف عبد الرزاق (٢/ ٥٥٦).

# ناوەڕۆك